# حەجامە

## سوننەتێکی پێغەمبەر ﷺ و چارەسەرێکی کەم وێنەی نەخۆشیەکان

نووسینی : انور احمد مصطفی

چاپی یەکەم

١٤٢٦ هەولێر ٢٠٠٥

* ناوی کتێب : حجامە سونەتێکی پێغەمبەر ﷺ و چارەسەرێکی کەم وێنەی نەخۆشیەکان

* ناوی نوسەر : انور احمد مصطفی

* ساڵ : ٢٠٠٥

* چاپ : یەکەم

* ژمارەی تیراژ : ﴿ ٨٠٠ ﴾ دانە

* ژمارەی سپاردن : ﴿ ٤٨٧ ﴾

* چاپخانەی چـــرا

## پێشــكەشــە بە :

* بە گیانی پاكی پێغەمبەری پێشەواو سەروەری هەموو عالەم ( محمد – صلى الله عليه وسلم ) .
* بە گیانی دايك و باوكی خۆشەویستم .
* بەو مامۆستا بەڕێزانەی كەلەخزمەتیاندا زانستە شەرعیەكانم خوێندووەو ئەوانەیشی كە سوودم لێ بینیون ..........

## تێبینی :.

**سوپاسی بەڕێز :**

**مامۆستای – حەجامە – كار جەنابی مامۆســـتا ( علی طاهر قادر ) دەكەم كە ئەركی پێداچوونەوەی ئەم نامیلـكەیەی گرتە ئەســـتۆی خۆی، خـــوای گەورە پاداشـــتی خێری بداتەوە.....**

## پێرست

بسم الله الرحمن الرحيم

# ڕێخۆشکردن

الحمد لله رب العالمين الذي علّم بالقلم علّم الإنسان مالم يعلم والصلاة والسلام على سيدنا محمد(ص) وعلى وأصحابه أجمعين .

أما بعد :

گومانی تێدا نیه کەخوای گەورە مرۆڤەکانیلەنەبوونەوە بەدی هێناوەو لەسەر جوانترین ونایاب ترین شێوە ڕێکی خستوون ونەخشەی کێشاون . وەدەستوورو یاسای ژیانیشی بۆ ناردون تا بەرچاو ڕوونانە بژین وبزانن ئامانج لەدروست کردنیان وهاتنیان بۆسەر زەوی چیە .

بەڵێ ئازیزان مرۆڤ خاوەنی پەیامێکی وەهایە گەر دەستی پێوە بگرێت ولەژیانی ڕۆژانەی خۆیدا پیادەی بکات هەم لەدونیادا خۆشی وخۆشگوزەرانی ڕووی تێدەکات وەلەدوارۆژیشدا ڕووسوری بەر بارەگای پەروەردگاری دەبێت ، پەیامێك کەدانەرەکەی خالق ودروست کەری مرۆڤەو هەر ئەویش دەزانێ مرۆڤ پێویستی بەچیە . پەیامێك کەمرۆڤایەتی هەرگیزاو هەرگیز پێویستی بەبەرنامەیەکی تر نابێت وهەرچی پێداویستی بەندەکانی خوایە تێیدایە ، بەسە بۆ گەورەیی ئەو پەیامە کەخوای گەورە لەبارەیەوە دەفەرموێ ﴿ أليوم أكملت لكم دينكم وأتممت عليكم نعمتي ورضيت لكم الإسلام ديناً ﴾ .

خوێنەری بەڕێز ئەم نامیلکەیەی بەردەرستت باس لەبابەتێکی زۆر گرنگ لەبواری پزیشکی فەرمودەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەکات کە کانزایەکی داپۆشراوو (معجزە)یەکی بێ وێنەیە لە چارەسەری نەخۆشیەکاندا .

زۆر بەداخەوە ئێمەی موسوڵمان زۆر لێی بێ ئاگاین ووەخەریکە ئەمەیش وەکو سەرجەم (اعجازە) زانستیەکانی قورئان وفەرمودە – لەبوارەکانی فەلەك وفیزیاو کشتوکاڵ وجیۆلۆجی و مرۆیی و چەندانی تر لەو اعجازاتانەی لە قورئان وفەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) باسی کراوەو حەقیقەت ڕاستیەکانیان لە ڕۆژئاواو لەسەر دەستی بێگانەو بێ باوەڕانەوە بۆ

ئێمه دەگەڕێتەوەو ئەوان پەردە لەسەر زانستە سەرسوڕهێنەرەکانی قورئان و سوننەت لادەدەن و ڕۆژانە لەپێشکەوتن و بەرەوپێشەوە چوندان .

ئەو بابەتەش کەدەمەوێ لێرەدا ئاماژەی پێ بکەم ولەسەری بدوێم بریتیە لە ( حەجامە ) .

حەجامە ( معجزە )یەکی بواری پزیشکیەو چارەسەری زۆربەی زۆری ئەو نەخۆشیانە دەکات کە پزیشکی ئەم سەردەمی تەکنەلۆژیاو ( تقدم )و پێشکەوتنەی ئەمڕۆ دەسەوستانن لە بەرامبەر چارەسەرکردنیدا .

ئومێدەکـــەم ئەم باســـە ڕێخۆشکردن ویادخستنەوەیەك بێت بۆ دڵسۆزان و خەمخۆرانی موسوڵمانی کورد زوبان ، تاوەکو بابەت وتوێژینەوەی لەسەر ئامادە بکەن وسوودو کەڵکەکانی لەبواری شەرعی و پزیشکیەوە بۆ خەڵکی ڕوون بکەنەوە تاوەکو ئەوانیش وەکو سەرجەم گەلانی دونیا لەم چارسەرە کەم وێنەیە بێ بەش نەبن .

نووسەر

# گرنگی ( حەجامە ) لای پزیشکان ومیدیا جیهانیەکان

سەرەتا پێش ئەوەی باس لەگرنگی دانی میدیایەکانی جیهان بکەم بە (حەجامە ) دەمەوێ ئاماژە بە بۆچوونی چەند پزیشکێکی ناوداری جیهانی بکەم کەباس لە (حەجامە ) دەکەن :

* **د. أمير محمد صالح** : مامۆستا لە زانکۆی شیکاغۆ – پزیشکی چارەسەری سروشتی ( علاج طبيعي ) وە ئەندامی ( جمعية الأمريكية ) لە – طب البديل – دا .

دوای ئەوەی باسی گرنگی (حەجامە ) دەکات لە چارەسەری نەخۆشیەکاندا پاشان هێرش دەکاتە سەر ئەو کەسانەی کەپێیان وایە (حەجامە) سوود وکەڵکی نیەو دەڵێ: ئەو کەسانەی هێرشی کوێرانە دەکەنە سەر چارەسەر بە ( حەجامە ) بابڕۆن بیخوێننەوەو خۆیان شارەزا بکەن لەو بوارەدا چونکە ( حەجامە ) مەسئەلەیەکی زانستیەو ئێستا ڕۆژئاوا بە پەلاسەوە بەدوایدا دەگەڕێ وچەندین عیادەی تایبەتیان داناوە کە چارەسەری نەخۆشیەکان تەنها بە (حەجامە ) دەکەن .

* **د. سعيد شكري** : مامۆستا لەزانستەکانی لوت وقوڕگ وگوێ – لەپەیمانگای ( السمع والكلام ) وەئەندامی كلية الطب – لەزانکۆی ( ئەوهایۆ )ی ئەمریکی .

دەڵێ : ئەو کەسەی دژایەتی شتێك بکات بەبێ ئەوەی هیچ زانیاریەکی هەبێت لەبارەیەوە ئەوە ئەو پەڕی نەزانینە ( جهل ) .

ئەو کەسانەیشی کەدژی چارەسەر بە ( حەجامەن )و باوەڕیان پێی نیە ئەوە شتێکی کاتیەوەو ڕاستیەکان ڕوون دەبنەوەو بەچاوی خۆیان دەیبینن .

- دوای ئەوەی لەسەر زاری پزیشکانەوە گرنگی چارەسەر بە ( حەجامە ) ڕاگەیاندرا هەریەك لەکۆشکی پاشایەتی ( قصر الملكي ) بەریتانی وسعودی نێردراوی تایبەتیان نارد بۆکۆکردنەوەی زانیاری تایبەت بە (حەجامە)[1]

(١) معجزة قرن العشرين – ل ( ٩ )

* ولآتی سویدیش بەرەسمی داوای کۆکردنەوەی زانیاری پێویستی تایبەت بە ( حەجامە )ی ڕاگەیاند .
* ولآتی یابانیش وەفدێکی بالآی پزیشکی ڕەوانەی سوریا کرد بەمەبەستی دەست حستن وکۆکردنەوەی ئەو زانیاریانەی کەتایبەتن بە ( حەجامە ) [(١)]
* باس وخواسی ( حەجامە ) گەیشتە ئاستی هەموو جیهان وکەناڵە جیهانیەکان بابەتی چڕوپڕیان لەسەر ئامادەکردو بەرنامەی تایبەتیان لەسەر پێشکەش کرد .

ئەمەی خوارەوە هەندێکن لەو ڕاگەیاندنانە :-

* ولآتی یابانیش وەفدێکی بالآی پزیشکی ڕەوانەی سوریا کرد بەمەبەستی دەست حستن وکۆکردنەوەی ئەو زانیاریانەی کەتایبەتن بە ( حەجامە ) [(١)]
* باس وخواسی ( حەجامە ) گەیشتە ئاستی هەموو جیهان وکەناڵە جیهانیەکان بابەتی چڕوپڕیان لەسەر ئامادەکردو بەرنامەی تایبەتیان لەسەر پێشکەش کرد .

ئەمەی خوارەوە هەندێکن لەو ڕاگەیاندنانە :-

**یەکەم / ئاژانسەکانی هەواڵی جیهانی :-**

- ئاژانسی هەواڵی ئەڵمانی ( وكالة الأنباء الألماني ) – اسوشيتيد پريس –
- ئاژانسی هەواڵی صینی ( وكالة الأنباء الصينية ) – شينجوا –
- ئاژانسی هەواڵی فەرەنسی ( وكالة الأنباء الفرنسية ) – رويترز –
- ئاژانسی هەواڵی ڕوسی ( وكالة الأنباء الروسية ) – نفوستی تايس –
- ئاژانسی هەواڵی یابانی ( وكالة الأنباء الياباني )
- ئاژانسی هەواڵی سوری ( وكالة الأنباء السورية ) – سانا –
- ئاژانسی هەواڵی کوێتی ( وكالة الأنباء الكويتية ) – كونا –
- ئاژانسی هەواڵی شرق الأوسط
- ئاژانسی هەواڵی سعودی ( وكالة الأنباء السعودية ) – واس –
- ئاژانسی هەواڵی ئوردنی ( وكالة الأنباء الأردنية )
- ئاژانسی هەواڵی ئێرانی ( وكالة الأنباء الإيرانية )

(١) الحجامة سنة نبوية معجزة طبية – ل ( ٢ )

## دووەم / ڕادیـۆ ناوخۆی وجیهانیەکان :-

- ڕادیۆی ( BBC ) بەریتانی
- ڕادیۆی دەنگی ئەمریکا
- ڕادیۆی ( الشرق )ی فەرەنسی
- ڕادیۆی ( العربیه )ی سوری
- ڕادیۆی دەنگی گەلی سوری
- ڕادیۆی ( قدس )

## سێیەم / کەناڵە ئاسمانیەکان :-

- کەناڵی ئاسمانی سوری
- کەناڵی ئاسمانی ( أبو ظبي )
- کەناڵی ئاسمانی ( المنار )
- کەناڵی ئاسمانی ئێرانی
- کەناڵی ئاسمانی ( دبی )
- کەناڵی ئاسمانی ( الجزيرة )
- تەلەفزیۆنی قەتەری
- تەلەفزیۆنی سوری

## چوارەم / ڕۆژنامەکان

- ڕۆژنامەی( تشرين ) و ( البعث ) و ( الثورة ) و الوحدة ) و ( الفداء ) و ( الجماهير ) و ( العروبة ) ی سوري .
- ڕۆژنامەی ( الحياة ) و ( الزمان )ی لەندەنی

- ڕۆژنامەی ( المحرر )ی فەرەنسی
- ڕۆژنامەی ( السفير ) و ( المستقبل ) و ( الكفاح العربى )ی لوبنانی
- ڕۆژنامەی ( الرياض ) و ( العكاظ ) و ( المدينة )ی سعودی
- ڕۆژنامەی ( البيان ) و ( الأخبار العربي ) ئیماراتی
- ڕۆژنامەی ( الأيام )ی بەحرێنی
- ڕۆژنامەی ( السياسيه ) و ( ألرأي العام ) كوێتی
- ڕۆژنامەی ( الوطن ) و ( الراية )ی قەتەری
- ڕۆژنامەی ( الوطن )ی عمانی
- ڕۆژنامەی ( الدستور )ی ئوردنی
- ڕۆژنامەی ( القدس )ی فەلەستینی
- ڕۆژنامەی ( الوفاق )ی سودانی

## پێنجەم / گۆڤارەكان

- گۆڤاری ( طبيبك ) و ( الحياة الصحية ) و ( الطب العربي ) و ( الغذاء الصحي ) و ( طبّب نفسك ) و ( سنوب ) و ( التكامل العربية )ی لبنانی
- گۆڤاری ( الصحة والطب )ی خەلیجی
- گۆڤاری ( النور ) و ( المشاهد السياسي )ی لەندەنی
- گۆڤاری ( نصف الدنيا ) و ( صباح الخير )ی میسری
- گۆڤاری ( المرأة العصرية ) و ( الصدى )ەی ئیماراتی
- گۆڤاری ( الخليج )ی كوێتی
- گۆڤاری ( اليمامه )ی سعودی

ئەمانەو چەندین كتێب ونامیلكەی زانستی لەسەر نووسراوە جگە لە ( موقع الإنترنيت ) كە دەیەها شوێنی تایبەت كردووە بە ( حەجامە )و ســـوودەكانی :-

ئەمەی بەردەستت هەندێکن لە وێنەی گۆڤار و ڕۆژنامەکان :-


الوحدة


الثورة


تشرين


الشرق




البعث

الحجامة


الوطن

الحجامة

تعقيدات الاستنساخ بين العلم والفلسفة




SyriaTimes

Economic News in Short

Modernising the Banking System


السفير

سوريا: إعادة اكتشاف الحجامة واختبارها
كاسات الهواء: العلاج التقليدي لأمراض


الزمان
AZZAMAN.NET

أطباء بريطانيون يتوجهون الى سوريا
لتعلم طريقة الحجامة في العلاج


«الحجامة» أو العلاج «بكاسات الهواء»


الرياض

الحجامة بفوائدها العلمية الدقيقة التي اكتشفها العلامة العربي
السوري محمد أمين شيخو تتصدى لأمراض العصر الفتاكة

# گرنگی چارەسەر لەشەریعەتی ئیسلامیدا

لە ڕاستیدا چارەسەری هەموو نەخۆشیەکان لەبنەما تەندروستیەکانی قورئان وسوننەتدا بوونیان هەیە ئیتر چی بەرێنمونی خۆپاراستن ( الوقایە ) بێت یان بە چارەسەر ( العلاج ) .

* ئەوەتا پێغەمبەری خوا (ﷺ) بنەمایەکی نەگۆڕی بۆداناوین کەپێی دەوترێت بنەمای چارەسەری ئیسلامی . پێش ( ١٤٢٥ ) ساڵ لەمەوبەر ئیسلام ئاماژەی پێی کردووەو دەست پێشخەری تێدا کردووەو . وەکو دەفەرموێ ﴿ ما أنزل الله داء إلاّ أنزل له دواء ﴾ صحیح بخاری .

ئەمەی لای خوارەوە چەند بەڵگەیەکن لەسەر ئەو گرنگی‌یەی کە ئیسلام دەیدا بە دەرمان و چارەسەر .

* لكل داء دواء فإذا أصاب دواء الداء برأ بإذن الله – رواه مسلم
* تداووا يا عباد الله فإن الله لم يضع داء إلاّ وضع له شفاء إلاّ داءً واحداً – الهرم وفي لفضه – إلاّ السّام – أي الموت – صححه الترمذي والحاكم وابن الخزيمة
* إن الله حيث خلق الداء خلق الدواء فداووا – رواه أحمد
* مأنزل الله داء إلاّ أنزل له دواء – رواه البخاري
* تداووا يا عباد الله فإن الله لم يضع داء إلاّ وضع له شفاء علمه من علمه وجهله من جهله – صححه ابن حبان والحاكم

– ئەم فەرموودانە هەموو بەڵگەن لەسەر ئەوەی کەچارەسەریش وەکو سەرجەم زانستەکانی تر لە خۆیەوە بەدەست نایەت بەڵکو پێویستی بەماندوبوون وشەونخوونی هەیە .

پێشەوا شافعی ( ڕەحمەتی خوای لێ بێ ) لەبارەی گرنگی چارەسەر لە ئیسلامدا دەفەرموێ:–

وانازانم زانستێك هەبێت لەپاش حەلاڵ وحەرامەکان پیرۆزترو گەورەتر بێت لە زانستی ( طب ) و چارەسەر لەگەڵ ئەم پیرۆزی وگرنگیەشدا موسوڵمانان فەرامۆشیان

كردووەو خستوویانەتە پشت گویّ ، باچاك بزانن كەئەوان سێیەكی زانستیان لەدەست داوەو داویانەتە دەست جولەكەو فەلەكان – اليهود والنصارى [١]

پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) لەژیانی پڕخێری خۆیدا توانی ئەو فەرموودانە بەرجەستە بكات ، ئەوەتا یەكەم پزیشكێك لە ئیسلامدا ئافرەتێك بوو بەناوی ( روفيدة الإسلمية ) ئافرەتێكی دەست ڕەنگین بوو لەزۆر لەغەزاكاندا كاری چارەسەرو دەرمان كردنی بریندارەكانی دەكرد بەتایبەت لەشەڕی ( خندق )دا لەو كاتەی ( سعدی كوری معاذ ) بریندار بوو، پێغەمبەر(ﷺ) ئەو ئافرەتەی تایبەت كرد بەچارەسەركردنی ( سعد ) تا چاك بۆوە .

* پێویستە ئێمە كاتێك باس لەبواری پزیشكی وچارەسەر دەكەین ڕۆڵی بەرچاو خزمەتی بێوچانی زانایانی ڕێزدارو ماندوونەناسی ئیسلامان لەبیر نەچێت بەتایبەت لە دەسەدەكانی ناوەراستدا كەتوانیان هەوڵەكانیان بخەنەگەڕ ولەژێر ڕۆشنایی ئایەتەكانی قورئان وفەرموودەكانی پێغەمبەر(ﷺ) پەردە لەسەر دەیەها نەخۆشی لابدەن ودەست نیشانی هۆكاری سەرهەڵدانی و ڕێگاكانی چارەسەركردنیشی بكەن وببنە مامۆستاو چاوساغ بۆ نەوەكانی دوای خۆیان لەهەموو بوارەكاندا لەگرنگترینی ئەو خزمەتانەی لەسەر دەستی زانایانی ئیسلام ودەرچوانی قوتابخانەی قورئاندا بەبواری پزیشكی كراوە ئەمانەی لای خوارەوە هەندێكیانن :-

- **ئاشـــكراكردنی نەخۆشی ( طاعون )** [٢] :-

لە ساڵی ( ١٣٧٤ )م پزیشكی ناوداری ئیسلامی ( لسان الدين الخصيب ) الاندلوسی كتێبێكی بلاْوكردەوە كەتیایدا باسێكی زانستی لەسەر نەخۆشی طاعون و گواستنەوەی لەكەسێكەوە بۆكەسێكی تر پێشكەش كرد لەكات وسەردەمێكدا ئەمەی ئاشكرا كردووە كە ( نە عدوى ونەجراثيم ونەميكروبات ) لای هیچ كەسێك ناسراو و زانراو نەبوو .

(١) الطب والأطباء – د. محمود دياب – ل ( ١٠٣ )

(٢) طاعون : ئەو نەخۆشیەیە كە بە هۆیەوە نەخۆشەكە دەرشێتەوە سكیشی دەچێت .

**٢- نەخۆشی سیل[١] :-**

زانای ناوداری ئیسلامی ( ابن سینا ) لە کتێبی ( القانون )دا دەڵێ زانایانی ئیسلامی یەکەم کەسێك بوون کەئەو نەخۆشیەیان ناسیوەو ئاماژەشیان پێ کردووە . ابن سینا خۆی یەکەم کەس بوو ئەوەی سەلماند کەنەخۆشی ( سیل ) بەهۆی بەرکەوتن وخواردن وئاووخۆڵەوە بۆ کەسانی بەرامبەر دەگوازرێتەوە .

**٣- نەخۆشی الجدری[٢] ( الحصبة )[٣] :-**

یەکەم کەس کەزۆر بەووردی و ڕوونی لەسەر هەردوو نەخۆشی ( الجدری و الحصبە ) قسەی کردو لەسەری نووسی زانای ئیسلامی ( ابوبکر الرازی ) بوو دەتوانم بڵێم کتێبەکەی ئەوبوو تا سەدەی (١٨) هەمیش بەسەرچاوەی یەکەم دانرا .

**٤- نەخۆشی الحکـة[٤] خوریکەی پێست :-**

زانای ناودار پێشەوا ( طبري ) توانی بۆیەکەم جار هۆکاری تووش بوون بە نەخۆشی ( الحکة ) خوریکەی پێست بدۆزێتەوەو پزیشکی ناسراوی ئیسلامی ( ابن زهر الاندلسی ) دوای هەوڵ وماندوبوونێکی زۆر توانی چارەسەری گونجاوی بۆ بدۆزێتەوە .

**٥- نەخۆشی گەڕی و بەڵەکی پێست ( الجذام و البرص ) :-**

هەردوو زانای ناودار ( ابن مسکویه و ابن الجزار ) وچەندانی تر لەو زانا بەڕێزانە کتێب و بابەتیان لەو دوو نەخۆشیەدا نووسیوە و تێیدا هۆکاری تووش بوون و چارەسەریشیان دەست نیشان کردووە .

---

(١) نەخۆشی ( سیل ) : ئەو نۆخشیەیە کە تووشی سینگ وسیەکان دەبێت .

(٢) جدری : نەخۆشیەکە تووشی پێست دەبێت وخاڵی ڕەش ڕەش لەسەر پێست دروست دەکات .

(٣) الحصبة : نەخۆشی سورێژەیە کە بە زۆری تووشی منداڵان دەبێت .

(٤) الحکة : نەخۆشی خوریکەی پێستە .

## ٦- نەشـــتەرگەری و برین پێچی :-

موسوڵمانان بۆیەکەم جار کاری نەشتەرگەری ( عملیات )یان ئەنجامداو توانیان سەرکەوتنی بەرچاو بەدەست بهێنن لەبواری نەشتەرگەری و برین پێچیدا .

بە هەوڵ وتوانای پزیشکی شارەزا لەنەشتەرگەری برین پێچی ( ابی القاسم الزهراوی ) توانرا کتێبێك دابنرێ بەناوی ( التصریف لمن عجز عن التألیف ) لەم کتێبەدا باس لە چۆنیەتی لەنجامدانی نەشتەرگەری ودەست نیشان کردنی کەرستەو پێداویستیەکانی برین پێچی دەکات وچەندین زانیاری تری بواری پزیشکی ئاماژە پێدەکات تەنانەت باس لەڕزگار کردنی ئەو نەخۆشانەش دەکات کەبەردی ناو گورچیلەیان هەیە ئەویش بەدەست نیشان کردنی هەندێك هۆکار بۆ شکاندن وتاواندنەوەی بەردی گورچیلە . مەشق وڕاهێنانی بەقوتابیەکانی دەکردو فێری ئەنجامدانی کاری نەشتەرگەری وبرین پێچی دەکردن . جێگەی ئاماژە پێکردنە ئەگە نەشتەرگەریەکە ( باطني ) وشوێنی داپۆشراو بووایە ، سیم وخێتی دوورینەوەکەی لە ڕیخۆڵەی ( پشیلە )[١] بۆ بەکاردەهێنا تاوەکو پێویست بەدەرکردنی نەکات وببێتەوە بەگۆشت .

نەوەبوو تا سەدەی (١٨)یش ئەو کتێبە جێگەی بایەخدانی پزیشکانی ئەوروپا بوو ، وەیەکێك بوو لەو کتێبانەی کەکرابووە ( منهج ) لەکۆلێژە پزیشکیەکاندا وانەی لەسەر دەخوێندرا [٢]

* چارەسەرو بواری پزیشکی لەئیسلامدا پانتاییەکی یەکجار فراوانی بۆجێهێلڕاوە تا مرۆڤەکان ئەسپی خۆیانی تێدا تاوبدەن ولەژێر تیشکی بنەمـــا پزیشـــکیەکانی قورئان و سوننەتدا بەهەوڵ ومانووبوونی خۆیان بتوانن چارەسەری گونجاو بۆسەرجەم نەخۆشیەکان بدۆزنەوە . لەگەڵ ئەوەشدا بۆ زیاتر کار ئاسانی پێغەمبەر(ﷺ) چەند چارەسەرێکـــی بۆدەســـت نیشان

---

١) نەو کارە ( والله أعلم ) هیچ بێ شەرعیەکی تێـدا نیـە چـونکە خـوای گـەورە مرۆڤـی کردۆتـە ( سـید ) وگەورەی ئەم کەونەو سەرجەم دروست کراوەکانی بۆخزمەتی ئەو دروست کردووە .
﴿ وسخر لکم ما في السموات وما في الأرض جمیعاً ﴾

(٢) الحجامة في الطب النبوي – ل ( ٢٤ )

کردووین تاوەکو ئێمە سوودیان لێ ببینین ، وەکو ( هەنگوین - ڕەشکە - حەجامە ) وە لە سەروی هەمووشیانەوە قورئان ،کە هەر یەکێك لەو چارەسەرانەی کە لەقورئان و سوونەتدا هاتوون بوونەتە جێگەی سەرسوڕمانی زانایانی بواری پزیشکی ئەم سەردەمی زانست وپێشکەوتنەی ئێستا وەلەئاستێکی زۆربەرزی زانستی نوێدا قسەوباسی لەسەر دەکرێ ولێکۆلێنەوەکان سەلماندوویانە کەباشترین چارەسەر کەهیچ کاریگەری خرابی بۆسەر لاشەی مرۆڤ نەبێت و ڕیشەکێشی نەخۆشیەکان بکات ئەو چارەسەرانەن کە لە قورئان و سوننەتدا باسکراون .

## مەبەست بە حەجامە چیە ؟

**حجامـــه** : لە زمانەوانیدا واتە : بەواتای ( مص ) دێت واتە : مژین .

* وشەی الحَجامة : لە ( حَجَـمَ ) و ( حَجَّـمَ ) وە وەرگـیراوە کـە دەڵـێ ( حَجَّـم الأمـر ) واتە :- هاتـــەوە سەردۆخی جارانی خۆی .

* حەجامە :- لە زاراوەی شەرعی وپزیشکیدا .

واتـە :- ڕاکێشـان ودەرهێنـانی خـوێنی پیســی ناولاشـە لەڕێگـەی پێسـتەوە کەدەبێتـە هـۆی بەهێزبوونی سـوڕی خـوێن وپالآفتـەبوونی وەهاتنـەوەی خـوێنی لاشـە بۆئاسـتی سروشـتی خۆی[1] .

* حەجامـە :واتـــە : شـەق شـەق کردنـی پێســت و دەرهێنـانی خوێـــن لێـوەی بەهـــۆی پەرداخێکی تایبـــەت[2]

(١) الحجامـــة في الطب النبوي - عبدالكريم محمد نصر - ل ( ٢٧ )

(٢) الشمائل المحمديـــة - الإمام ابي عيسى محمد ابن سورة الترمذي - ل ( ١٠ )

# جۆرەكانی حجامە

حجامە بەشێوەیەكی گشتی سێ جۆری سەرەكی هەیە ، هەرچەندە هەندێك لەزاناكان ( فصد ) . واتە :- خوێن بەردانیش بەجۆرێك لەجۆرەكانی حجامە دادەنێن ، بەلاّم خوێن بەردان ( الفصد ) جیاوازە لەگەڵ حجامەو هەر لەگەڵ پێناسەی حجامەشدا ناگونجێ ، چونكە حەجامە واتە:- ڕكێشان ودەرهێنانی خوێن لەپێستەوە بەلاّم خوێن بەردان ( الفصد ) خوێن بەردانە لەدەمارەوە كەوابوو جیاوازی زۆرە لەنێوان حجامە و( الفصد )دا . جۆرەكانی حجامە بەكورتی ئەمانەی لای خوارەوەن :-

**١- حجامەی تەڕ - الحجامة الرطبة :**

ئەم جۆرەیان لەحجامە ئەوەیە كەشوێنی دەمی بەرداخەكە بەموس شەق شەق وبریندار دەكرێت و خوێنی لێوە دەردەهێنرێت .

**٢- حەجامەی ووشك – الحجامة الجافة :**

ئەمەشیان وەكو جۆری یەكەمە بەلاّم شوێنەكەی واتە شوێنی دەمی بەرداخەكە لەناوشاندا بریندار ناكرێت جیاوازیان تەنها ئەوەیە كەكردنی ئەم جۆرە لەحجامە تەنها بۆ ئەوەیە كەئازاری لاشە كەم ببێتەوە بەگوشین و ڕاكێشانی پێست .
فعلاً كاریگەری زۆریشی دەبێت لەسەر كەم كردنەوەی ئێش وئازار بەكورتی چارەسەرێكی كاتیەو پاش ماوەیەك ئازارەكەی دەست پێ دەكاتەوە .

**٣- حەجامە بەكرمی زالو – الحجامة بدود العلق :**

كرمی زالو وەكو ( ابن منضور ) لە ( لسان العرب )دا دەڵێ :-
( علق ) كرمێكی سورە لەناو ئاودا دەنوسێنرێت بەلاشەوە تاوەكو خوێنی مرۆڤ بمژێ و بەهۆیەوە مرۆڤ ڕزگاری ببێت لەخوێنی زیادەو پیس بووی ناو لاشە .
لە فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) باسی ئەم جۆرە لە حەجامە كراوەو بەشیفاو چارەسەر دانراوە وەكو دەفەرموێ ﴿ خير الدواء العلق والحجامة ﴾ . ئێستا لە زۆر ولاّتانی دونیا

ئەو کرمە بەکار دەهێنرێ بۆ مژینی خوێنی زیادەی لەش وسوودی زۆریشی لێ بینراوە ، مەبەستی سەرەکی من لەنووسینی ئەم باسە جۆری یەکەمە لە حەجامە :
واتە :- حەجامەی تەڕ، چونکە لەهەموو جۆرەکان سوودمەنترو بەکەڵك ترەو بنەبڕو ڕیشەکێشی نەخۆشیەکان دەکات بەپێچەوانەی ئەوانی تر .

## حوکمی حجامە لە شەرعدا :

حوکمی حجامە لە شەرعدا بە پێی ئەو فەرمودە ( صحیحە )انەی کە لە بارەویەوە هاتوون و ئیمانداران هەڵدەنێن لەسەر حجامە کردن حوکمەکەی سوننەتە ( والله أعلم ) .
ئەوەتا پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ : خیر ما تداویتم به الحجامة .
گومانیشی تێدا نیە کە گوێڕایەڵی پێغەمبەر(ﷺ) خوای گەورە فەرمانی پێ کردووە .
﴿ وما آتاكم الرسول فخذوه وما نهاكم عنه فانتهوا ﴾ الحشر – ٧ –[1]

(١) دليل الحجامة والحجامين – حقي و أبو عبدالرحمن عادر بن سعيد – ل ( ١١ )

# پێداویستی و کەرەستەی حەجامە

دیارە حەجامە کۆمەڵێك پێداویستی تایبەتی خۆی هەیە پێویستە لەسەر حەجامەکار دابینی بکات ورەچاوی پاك وخاوێنیان بکات .

ئەمەی لای خوارەوە پێداویستیەکانیەتی :-

١- پەرداخی حەجامە کردن - کەپێی دەوترێت ( کاسات الهواء ) ، لە شووشە دروست کراوەو شێوی بلوری هەیە .

٢- پێداویستی برین وبرین پێچی وەکو : لفاف ودیتۆل ولەزگەو ....... هتد .

٣- دەست کێشی پزیشکی .

٤- مەقەست وموسی ( معقم ) .

٥- دەستەیەك ( پەمۆ ) لۆکەی پزیشکی .

٦- شقارتە یان چەرخ .

٧- وەرەقەیەك کە زوو گڕ بگرێت وەکو لاپەڕەی رۆژنامە .

# بەڵگە شەرعیەکان لەسەر دروستیەتی حەجامە

پێش ئەوەی باس لە بەڵگە شەرعیەکان بکەم لەسەر حەجامە دەمەوێ ئەوە بڵێم کە حەجامە لەپێش ئیسلامیشدا هەبووە تەنانەت هەندێك لەسەرچاوەکان باس لەوە دەکەن کەپێغەمبەرانی خوا وەکو حەزرەتی عیسی و موسی ( درودی خوایان لێ بێت ) وەسیەتیان پێ کردبێ وداوایان لەشوێن کەوتوانیان کردبێ کەحەجامە بکەن .

* وە لەسەردەمی ( بابلی وسینی و فراعنە )ەکانیشدا گرنگی پێ دراوە ئەمەش بەئاشکرا بەشوێنەوارەکانیاوە دەبینرێ کەحەجامەیان کردووە بۆ چارەسەری هەندێك لەنەخۆشیەکانیان.[1]





* پاشان دەنگ وباسی نەماو خەڵکی لێی بێ ئاگابون تا هاتنی پێشەوای مرۆڤایەتی حەزرەتی محمد (ﷺ) .

پێغەمبەری خوا (ﷺ) حەجامەی زیندوو کردەوە لە دوای نەمانی شوێنەواری بە شێوەیەك گرنگیەکی یەکجار زۆری پێدا تەنانەت ئەوەندە سووربوو لەسەر کردنی حەجامە .

(١) موضوع من الإنترنيت

ابن عباس دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) لەکاتی احرام و بەڕۆژوبوون و سەفەریشدا حەجامەی دەکرد ، زانایانیش دەفەرموون ئەوە ئەو پەڕی گرنگی حەجامە دەردخات .

* حەجامە لەدەیەها فەرموودەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) هاتووە لەهەرسێ بواری فەرموودەدا ( قولی و فعلی و تقریری ) .

ئیمانداران هەڵنراوە تاوەکو بیکەنە عادەتی خۆیان بۆئەوەی لەش ساغ و تەندروست باش بن وە لە هەندێك لە فەرموودەکاندا فەرمانی پێکراوە .

* ئەمەی لای خوارەوە هەندێکن لەبەڵگە شەرعیەکان لەسەر حەجامە :-

١- عن ابن عباس رضي الله عنه – عن النبي (ﷺ) قال : الشفاء في ثلاثة : شربة عسل ، أو شرطبة محجم ، أو كية نار وأني أنهى أمتي عن الكي .(١)

٢- عن جابر بن عبدالله رضي الله عنهما – قال سمعت النبي (ﷺ) يقول : ان كان في شيء من أدو يتكم خير ففي شرطة محجم أو شربة عسل ، أو لدغة بنار – توافق الداء ، وما أحب ان أكتوى.(٢)

٣- عن أنس رضي الله عنه – أن النبي (ﷺ) قال : خير ما تداوتم به الحجامة .(٣)

٤- ان أفضل ما تداويتم به الحجامة ، أو هو من أمثل دوائكم .(٤)

٥- قال (ﷺ) ما مررت من ليلة أسرى بي بملأ من الملائكة إلاّ قالوا : يا محمد مرامتك بالحجامة.(٥)

٦- ما مررت ليلة أسري بي بملأ من الملائكة إلاّ كلهم يقول لي : عليك يا محمد بالحجامة .(٦)

---

(١) صحيح البخاري – ج/١٠

(٢) صحيح البخاري

(٣) صحيح البخاري – رقم ( ٥٣٧١ )

(٤) متفق عليه

(٥) صحيح الجامع – ٥٦٧١ – وصححه ألباني

(٦) صحيح الجامع – ٥٦٧٣ – وفي مشكاة ٤٥٤٤ وصححه ألباني

# هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) و حەجامە

وەکو لەسەرەتاوە باسم کرد پێغەمبەری خوا (ﷺ) گرنگیەکی یەکجار زۆری بە حەجامە دەداو هاوەڵانیشی لەسەر هەڵدەنا هاوەڵانیش ڕەزای خوایان لێ بێت بەو پەڕی گەرم وگوڕیەوە فەرمانەکانی پێغەمبەریان جێبەجێ دەکرد هەنگاو هەنگاو کردارو گوفتارو ڕەفتاری ئەو سەر وەریان هەڵدەگرتەوە ئەمەی لای خوارەوە چەند نموونەیەکە لەگرنگی دانی هاوەڵان بەحەجامە :-

١- عبداللە کوڕی ابی نعم : دەڵێ چووم بۆ لای ئەبوهورەیرە حەجامەی دەکرد پێی وتم : باوکی (حەکەم ) حەجامە بکەن . وتم تائێستا نەم کردووە . وتی : پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاگاداری کرد کەجبرائیل ئاگاداری کردەوە کەحەجامە باشترینی چارەسەرەکانە .[١]

* عبداللە کوڕێ عمری کوڕی خطاب ڕەزای خوای لێ بێ وأبو موسی و سعدی کوڕی أبی وقاص وچەندینی تر لەو گەورە زانایانە حەجامەیان کردووەو گرنگیان پێداوە .
* جابری کوڕی عبداللە سەردانی پیاوێکی نەخۆشی کرد بەناوی ( مقنع ) بینیق زۆر نەخۆشە . جابر : فەرموی جێت ناهێڵم ولێرە ناڕۆم تا حەجامەت بۆ نەکەم چونکە گوێم لەپێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەیفەرموو ﴿ ان فیه شفاء ) بێگومان حەجامە شیفاو چارەسەری تێدایە .
* وە لەسەردەمی دوای هاوەڵان و تابعینیشدا گرنگی تایبەتی پێدرا .

---

(١) رواه الحاكم وقال صحيح على شرط شيخين – ٣٩/٤

# هۆكاری گرنگی نەدانی خەڵكی بە حەجامە

حەجامە لەگەڵ ئەو هەموو سوودو كەڵكە زۆرەی كەهەیەتی ولیٚی بینراوە دەبینین وەكو پێویستە خەڵكی نەیان كردووەو خۆیان لیٚی بەهرەمەند نەكردووە . ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆچەند هۆكارێك لەوانە :-

١- سوود نەبینینی ئەو كەسانەی كەحەجامەیان كردووە خەڵكی كەدەیانبینی كەسێك حەجامەی دەكردو هیچ سوودێكی ئەوتۆی لیٚ نەدەبینی ناچار لیٚی دوور دەكەوتنەوەو واحاڵی دەبوون كەحەجامە هیچ سوودێكی نیٚیە ، من وادەبینم ( والله أعلم ) هۆكاری سەرەكی بۆئەو سوود نەبینینە لەحەجامە ئەوەبوو كەڕەچاوی كات وشوێنی تایبەتی بۆحەجامە نەدەكرا وەكو ئەوەی ڕەچاوی مانگە تایبەتیەكان بۆحەجامەو ڕەچاو نەكردنی برسێتی وتێری وشەوو ڕۆژو گەرماو سەرما ..... هتد .

٢- تووش بوونی ئەوكەسانەی كەحەجامەیان دەكرد بەچەندین نەخۆشی ئەمەش دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی حەجامەكاران ئەو موسەی كەبەكاریان دەهێنا بۆحەجامەكردن بەكاریان دەهێنا بۆچەندین كەس ، كەئەمەش دەبووە هۆی تووش بوونی حەجامەبۆكارو بەچەندین نەخۆشی بۆگوازراوە (العدوى ) .

٣- ئەنجامدانی كاری حەجامە ببووە بۆماوەیی ( وراثة ) ئەگەر كەسێك ئەنجامدانی كاری حەجامەی بزانیبا حەزی نەدەكرد جگە لەنزیكەكانی خۆی وكەس وكاری هیچ كەسێكی تر فێری ئەنجامدانی ئەو كارە ببێت ، ئەمەش هۆكارێك بوو بۆ ئەوەی كە حەجامە كەمتر ئەنجام بدرێت وبلاْوببێتەوە لەناو خەڵكدا .[1]

٤- ئەوانەی كە حەجامەكار بوون وكاری حەجامەیان ئەنجام دەدا بۆ خەڵكی لە ٩٠٪ هیچ ڕۆشنبیریەكی بواری پزیشكیان نەبوو بەتایبەتی لەوڵاتە عەرەبیەكاندا . بەڵام ئێستا سوپاس بۆخوا .

(١) العلاج بالحجامة بين الطب والدين -- محمد نبيه – ل ( ١٢ ) – مكتبة الصفاء

به هۆی ئەو پێشکەوتنە زانستیەی کەمرۆڤایەتی بەخۆیەوە دەبینێ توانراوە کاری حەجامە بەو شێوازە ووردە تایبەتیەی کەبۆی دیاری کراوە لەشەریعەتی ئیسلامی پیرۆزدا ئەنجام دەدرێ ، ئەمەیە وای کردووە کەسەرنجی نەك تەنها موسڵمانان بەڵکو بێ باوەڕانیش ڕابکێشێت وایان لێ بکات کەنەخۆشخانەی تایبەت بە حەجامە دابنێن وپزیشکی تایبەت ( متخصص ) لەبواری حەجامەدا تەرخان بکەن بۆکارکردن لەو نەخۆشخانانەدا .

## چۆنیەتی ئەنجامدانی کاری حەجامە

سەرەتا پێویستە لەسەر حەجامەکار هەموو پێداویستی وکەرستەکانی حەجامە ئامادە بکات کە لە سەرەتاوە ئاماژەمان پێ‌کرد ، پاشان بەم شێوەیە دەست دەکات بە ئەنجامدانی کارەکەی :-



١- داوا لە حەجامەبۆکار دەکات کە جلەکانی لای سەرەوەی دای بکەنێت واتە لە پشتێنە بەرەو سەر ( ئەمە بۆ پیاو ، بەڵام ئەگەر حەجامەبۆکراو ئافرەت بوو ئەوا تەنها بە ئەندازەی دەبی پەرداخەکان ڕووت دەکات ) . ئەمە و ئەگەر حەجامەبۆکراو پشتی تووکن بوو ئەوا بە ئەندازەی شوێنی دەمی پەرداخەکان مووەکەی لادەدرێت تا بە جوانی دەمی پەرداخەکان پێستە بگرێت

٢- دەبێ حەجامەبۆکراو بە شێوەی چوارمەشقی ( مربع ) دابنیشێ هەروەکو چۆن لە وێنەکەدا دیارە .

٣- حەجامەكار ئەو وەرەقەیەی كەئامادەی كردووە ئاگری دەدات وبەدەستی چەپی دەی گرێت تاوەكو بەجوانی ئاگر دەگرێت ، پاشان بەدەستی ڕاستی پەرداخەكە دەگرێت و وەرەقە ئاگردراوەكە دەخاتە ناو پەرداخەكەوە كەمێك بەتوندی وبەلاّم زۆر بەلێزانی دەیدات لەپشتی حەجامەبۆكراو . پەرداخی دووهەمیش بەهەمان شێوە .

**تێبینی //** ئەگەر پەرداخەكان بەباشی پێستەكەی نەگرت ئەوا دووبارەی دەكەینەوە . ئەم پەرداخ لێدانەی یەكەم تەنها بۆڕاكێشانی پێست و كۆكردنەوەی خوێنە لەناو شان ( كاهل ) . بۆیە بە هیچ شێوەیەك شوێن دەمی پەرداخەكان برینـدار ناگرێت .



٤- حەجامەكار بۆماوەی ( ٢-٤ ) خولەك لەپەرداخەكان دەگەرێت وچاوەوانی دەكات ، پاشان دەست دەكات بەلێكردنەوەی پەرداخی یەكەم وناوەكەی پاك دەكاتەوەو بۆدووەم جار لێی دەداتەوە ، پەرداخی دووەمیش بەهەمان شێوە .

**تێبینی //** حەجامەكار بۆخۆی سەرپشكە لەچەند دووبارە كردنەوەی بەپێێ پێویستی كەسەكە .

٥- حەجامەكار وەكو جارى يەكەم دەست ئەكات بەلێ كردنەوەى پەرداخى يەكەم دواى پاك كردنەوەى ناو پەرداخەكە پاشان بەموسێكى پاكى بەكار نەهاتووى معقم شوێنى دەمى پەرداخەكان يەك لەدواى يەك تەنها پێستەكەى شەق شەق دەكات بەلايەنى كەم لە سێ تا چوار شوێنەوە بريندار دەكات ، بەم شێوەيە نوكى موسەكە لەنێوان هەردوو پەنجەى كەڵەو شايەتمانى دەستى ڕاستى دەردەهێنى وسەبرسەبر بەشێوەى ستوونى پێستەكە بريندار دەكات، وەكوجارەكانى تر پەرداخەكەى لێ دەداتەوە ئەوەى دووهەميش بەهەمان شێوە.



٦- حەجامەکار چاوەڕوان دەکات تا یان پەرداخەکان پڕ دەبن یان نیوە دەبن یەك یەك لێیان دەکاتەوەو شوێنەکانیان پاك دەکاتەوەو بۆچەند جارێکی تر بەپێی پێویستی کەسەکە لێی دەداتەوە .



٧- دوای ئەوەی حەجامەکار بینیتی وا خوێنەکە خەریکە دەبێتەوە خوێنی سروشتی ( طبيعي ) لەیەك لەدوای یەك پەرداخەکان لــێدەکاتەوەو خوێنەکانیان بەتاڵ دەکاتەوە بە لۆکەو دیتۆل وە بەپارچە ( لفاف )ێك لەسەر هەریەك لە برینەکان دادەنێت و بە لەزگە جوان قایمی دەکات پاشان ڕێنمونی پێویستی دەکات و بەرێی دەخات .



## ئایا تەمەنێکی دیاری کراو هەیە بۆ حەجامە کردن

حەجامە بۆ هەردوو ڕەگەزی پیاوو ئافرەت ئەنجام دەدرێت و بۆ هەر یەکەیان سوودی تایبەت خۆی هەیە. وەهەر یەکەیشیان تەمەنێکی دیاری کراوی بۆدانراوە تالەو تەمەندا حەجامە بکات .

* پیاوان تا تەمەنیان نەگاتە ( ٢٠ ) ساڵی حەجامەیان بۆ ناکرێت مەگەر زۆر پێویست بن چونکە ئەوانەی تەمەنیان لە خواروی ( ٢٠ ) ساڵانەوە زۆر پێویستیان بە ماددەی ئاسن هەیە لەلاشەیانداو زۆر کات حەجامە بۆ ئەوان زەرەرمەندە .
* بۆ ئەم مەبەستە دەستەیەکی پزیشکی تایبەت بە حەجامە هەڵسان بە تاقی کردنەوەیەك لەسەر خوێنی حەجامە کەڵەوکەسانە وەرگیرابوو کەتەمەنیان لەخواروی ( ٢٠ ) ساڵانەوە بوو دوای تاقی کردنەوە دەرکەوت ئەو خوێنە زۆر نزیکە لە خوێنی سروشتیەوە ، بە پێچەوانەی ئەو کەسانەی کەتەمەنیان لە ( ٢٠ ) ساڵ بەرەوسەرە خوێنەکەیان کەبە حەجامە دەرکراوە بەس تەنها خوێنی پیس و بێ کەڵکە .

* ئافرەتانیش وەکو ووتم حەجامە دەکەن وبۆشیان دەکرێت .

لە فەرموودەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتووە کە ئافرەتانی صەحابی حەجامەیان کردووەو نەك هەر ڕێیان لێ نەگیراوە بەڵکو هەڵنراون و ڕێگەیان بۆخۆشکراوە تا ئەوانیش لەو چارەسەرە بێبەش نەبن ئەوەتا لەفەرموودەدا هاتووە کە أم سلمە داوای کردووە لە پێغەمبەر (ﷺ) تارێگەی بدا بۆحەجامە کردن پێغەمبەر (ﷺ) فەرمان دەکات بە پیاوێك بە ناوی ( أبا طيبة ) کە حەجامە بۆ أم سلمە بکات .

* زاناکان دوو بۆچوونیان لەبارەی ئەو فەرموودەیە هەیە کە دەفەرموێ :﴿ ان أم سلمة استأذنت رسول الله في الحجامة ، فأمر النبيّ (ﷺ) ابا طيبة أن يحجمها ﴾[1]

* هەندێکیان دەفەرمون – ابا طيبة برای شیری أم سلمە – بووە بۆیە پێغەمبەر(ﷺ)ڕێی پێداوە.

* هەندێکی تریشیان دەفەرموون – أبو طيبة – منالێك بووە کەهێشتا بالغ نەبووە . بە هەرحاڵ فرە بۆچوونی هەیە لەم فەرموودەیەدا کەئایا دروستە پیاو حەجامە بۆئافرەت بکات یان نا وە بە پێچەوانەوە ئافرەت بۆپیاوی بکات .

لە کتێبی ( فقه المنهجيدا ) لەلاپەڕە ( ١٣٧ – بەرگی ١ )دا ئەو فەرموودەیەی سەرەوە کە ( جابری کوڕی عبدالله ) ڕەزای خوای لێ بێ دەیگێڕێتەوە دەکاتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە دروستە پیاو دەرمان و چارەسەری ئافرەتان بکات بەتایبەت حەجامە بە چەند مەرجێك :

١– ئەگەر ئافرەت دەست نەکەوت بۆ حەجامەکردن .

٢– دەبێ ئەو ئافرەتە کەسێکی مەحرەمی خۆی لەگەڵدابێت .

٣– لەئەندازەی پێویست بەدەر بەدەری نەخات واتە لاشەی .

---

(١) رواه مسلم – ( ٣٣٠٦ )

* باشترین شت ئەوەیە کە ئافرەتانیش فێری کاری حەجامە کردن بکرێن تاوەکو بۆ هاوڕەگەزانی خۆیانی بکەن وئەوە باشترین ڕێگەیە بۆ ڕزگار بوون لەم ( اختلافە )ی کەلەنێوان زاناکاندا هەیە .

* شایستەترین تەمەن کە ئافرەت حەجامەی تێدا بکات دوای تەمەنی ( ٤٠ ) سالآنە بە تایبەت ئەو کاتانەی کە ( عادە )ی مانگانەی بەیەکجاری دەوەستێتەوە کە پێی دەوترێت ( حالات الیأس ) لە شەرعدا واتە وەستانەوەی یەکجاری خوێنی ( حیض ) ، چونکە بە زۆری ئافرەتان لە دوای تەمەنی ( ٤٠ ) ساڵی تووشی ئەو حاڵەتانە دەبن .

* حیکمەتیش لەمەدا ئەوەیە کەخوای گەورە بۆڕزگار بوونی ئافرەتان لەو خوێنە پیسەی کەمانەوەی دەبێتە مایەی تووش بوونی بەچەندین نەخۆشی ، ڕێگەیەکی سروشتی داناوە تالەوێوە دەربچێت و ڕزگاری ببێت لێی . کە.ئەویش بریتیە لە ( حیض ) ( عادە الشهریە ) .

* د. عزیز صالح جواد الغزاوی پزیشکی نەخۆشیەکانی ( القلب والاوعیە الدمویە ) دەڵێ : ئافرەتان تاتەمەنیان نەگاتە ( ٤٠ ) سالآن هیچ مەترسیەکی ئەوەیان لێ ناکرێ کەتووشی نەخۆشی ( الجلطة القلبیة ) بن چونکە هۆکاری سەرەکی بۆتووش بوون بەو نەخۆشیەو چەندانی تر . مانەوەی خوێنی پیسی ناو لاشەیە کەئافرەتان بەهۆی ( عادە )ی مانگانەوەو لەو ڕێگایەوە خوێنی پیس ولەکارکەوتوو دەردەچێت وڕزگاریان دەبێت . بەلآم دوا تەمەنی ( ٤٠ ) ساڵی ( معرض )ن بۆتووش بوون بەو نەخۆشیانەی کەباسم کرد .

بۆیە پێویستە لەسەر ئافرەتان کاتێك ( عادە )یان بۆ یەکجاری دەوەستێتەوە ، ڕێگەیەکی تر بگرنەبەر بۆ خۆڕزگارکردن لەو خوێنە پڕ لە نەخۆشیەی کەتائێستا لەڕێگەیەکی سروشتی خواکردیەوە دەردەچوو بێ گومان ئەو ڕێگەیەش بریتیە لەحەجامە .

* لێرەدا دەرکەوت حەجامە هۆکاری سەرەکیە بۆڕزگاربون لەو خوێنەی کەمانەوەی لەلاشەدا دەبێتە مایەی تووش بوون بەچەندین نەخۆشی کوشندە .

# کاتی گونجاو بۆ حەجامەکردن

ڕەچاوکردنی کاتە گونجاوەکان بۆکردنی حەجامە هۆکاری سەرەکیە بۆ سەرکەوتوبوون و بوون بەچارەسەری نەخۆشیەکان بە پێەوانەشەوە واتە ڕەچاو نەکردنی ئەو دەستورەی بۆی دیاری کراوەو ئەو کاتەی بۆی دانراوە وا دەکات کە حەجامە هیچ کاریگەریەکی ئەو تۆی نەبێت (والله أعلم) هەر ئەمەیشە کەوای کردووە کە خەڵکی گرنگیەکی باش نەدەن بە حەجامە و لێی دوور بکەونەوە .

بۆیە پێویستە لەحەجامەکردندا چوار ( موعد ) ڕەچاوبکرێت تاوەکو حەجامە کردنەکە بەرئەنجامی باشی هەبێت :-

**١- موعدی ساڵانە " موعد السنوی " :**

پێویستە ساڵانە حەجامە بکرێت بۆئەوەی ئەگەر نەخۆشیەکی هەبوو چارەسەر بکرێت ئەگەر نەیبوو زیاتر لەشە ساغ وتەندروست باش بێت ، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەموێ ﴿ نعم العادة الحجامة ﴾ باشترین شت کەبکرێت عادەت وساڵانە ئەنجام بدرێت حەجامەیە .

بەڵام ئەگەر کەسێك نەخۆش بوو پێویستی پێی هەبوو دەتوانێت لەساڵێکدا چەند جارێك حەجامە بکات .

**٢- موعدی وەرزی " الموعد الفصـــلی " :**

لەناو فەسڵ و وەرزەکانیشدا باشترین وەرز بۆ حەجامەکردن وەرزی بەهارە ، چونکە وەرزێکی مام ناوەندە لە نێوان ساردی وگەرمیدا . فەرمودەی پێغەمبەریش (ﷺ) ئاماژە بە وەرزی بەهار دەکات ودەفەرموێ ﴿ استعینوا علی شدّة الحرّ بالحجامة ﴾ گومانیشی تێدا نی‌یە کە ( شدة الحر ) وگەرمای زۆر لە هاوینان دایەو پێغەمبەری خواش (ﷺ) دەفەرموێ ﴿ لەپێش هاتنی گەرمادا حەجامە بکەن﴾کەئەویش وەرزی بەهارە .

**٣- موعدی مانگانە " موعد الشهری ":**

لەناو مانگەکانیشادا لەمانگی ( نیسان و مایس ) وەدەش توانرێ لەکۆتایی ( مانگی اذار و سەرەتای مانگی حوزەیران )یشدا بکرێت .

وه گشت فەرموودەکان ئاماژە بەنیوەی دوایی مانگە ( قمری )یەکان دەکەن بۆ حەجامەکردن .

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ :

﴿ الحجامة تكره أول الهلال ، ولا يرجى نفعها حتى ينقص الهـــلال ﴾[1]

* پێشەوا ابن القيم : دەڵێ ( قسەی کۆی پزیشکان هاوتەریبە لەگەڵ ئەو فەرموودانەدا کە باس لەنیوەی دوایی مانگ .واتە : لە ( ١٥ ) بەرەو سەر دەکەن بۆحەجامە . پزیشکەکان دەڵێن : دوای تاقیکردنەوەکان لەسەر حەجامە دەرکەوت کەئەو حەجامەیەی کەلەسەرووی ( ١٥ )ی مانگەوە دەکرێت زۆر سوودمەنترە لەوەی لەخواروو ونیوەی یەکەمی مانگدا دەکرێت وخوێنەکەشی زۆر لەخوێنی سروشتیەوە نزیکە [2]

## ٤- موعدی ڕۆژەکان " الموعد اليومی " :

لە ناو ڕۆژەکانیشدا فەرموودە ئاماژە بە چەند ڕۆژێکی دیاری کراو دەکەن وەکو دەفەرموێ

﴿ من احتجم لسبعة عشر وتسعة عشر واحدى وعشرين كان شفاءً من كلّ داء ﴾ [3]

* وقال (ﷺ) : ﴿ اختجموا خمس عشرة ، أو لسبع عشرة ، أو لتسع عشرة أو احدى و عشرين لا يتبغ بكم الدم فيقتلكم ﴾ [4]

* وە باشترین ڕۆژ کە زۆر لە فەرموودەکان باسی دەکەن بریتیە لە :

( ١٧ ) تا ( ٢٧ )ی مانگ و لایـــەنی پزیشکیش ئەو ماوەیە بە باشترین کات دادەنێ .

(١) أخرجه العجلونيفي كشف الخفا – ١/٤١٥ – وابن الجوزي في تذكرة الموعضات

(٢) الحجامة في الطب النبوي – عبدالكريم محمد نصر – ل ( ٨٤ )

(٣) رواه أبو داود والحاكم على شرط مسلم

(٤) رواه البزاز وأبو نعيم في الطب النبوي – والطبراني والديلمي عن ابن عباس

* ابن سينا ڕەزای خوای لێ بێ باشترین کات بۆ حەجامە کردن پاش ڕۆژهەڵاتن کات ژمێر (٨–٩)یە چونکە ئەو کاتە دوای لە خەو هەڵسانە کەبۆماوەی زیاتر ( ٧ ) کات ژمێر لاشە لە جوولە کەوتووەو حەساوەتەوەو هەست بە برسێتی دەکات ئەمانەش هەموو داخوازی حەجامەن . وەکو پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ :

﴿ الحجامة على الريق دواء وعلى الشبع داء ﴾[1]

وە دەفەرموێ ﴿ الحجامة على الريق فيها شفاء وبركة ﴾

# شوێنی حەجامە لە لاشەدا

دیارە شوێنی حەجامە لەلاشەدا فەرمودەی زۆری لەبارەوە هاتووەو کەهەر یەکەیان باس لەشوێنێکی لاشە دەکەن بۆحەجامەکردن بەلاّم بەشێوەیەکی گشتی شوێنێکی دیاری کراو نیە کەفەرموودە تەنها ئەو شوێنی دیاری بکات .

* حەجامە بوارێکی ( اجتهادی )یە وپزیشکیە ، عیبادەت نیەو خەڵکی بەلێکۆڵینەوەو تاقی کردنەوە دەتوانن شوێنێکی دیاری بکەن .

* أبو القاسم خلف الزهراوي المتوفى سنة ( ٤٠٤ ) هجري لەکتێبی ( التصريف لمن عجز عن التأليف )دا دەڵێ : ئەو شوێنانەی لەلاشەدا خوێنیان لێوە وەردەگیرێت زیاتر لە ( ١٤ ) شوێنن ولەفەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) ئاماژە بەزۆریان کراوە .

ئەوەی ئێستا دوای لێکۆڵینەوەو تاقی کردنەوە لەسەر سەدەها نەخۆش دەرکەوتووە کە باشترین شوێن بۆحەجامە لەلاشەدا بریتیە لەنێو شان ( الكاهل ) .

زۆرینەی فەرموودەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) باس لە ( الكاهل ) دەکەن . أنس ڕەزای خوای لێ بێ دەفەرموێ : ان رسول الله (ﷺ) كان يحتجم فى الكاهل .[2]

---

(١) ذكره ابن القيم في الطب النبوي – ( ١٣٩ )

(٢) و حسنه أبو داود والترمذي وصححه الحاكم

* وەکو ووتم بواری پزیشکی ( الکاهل ) بەباشترین شوێن دەزانیّ بۆ حەجامە لێوە کردن لەبەر ئەم خالآنەی خوارەوە :-

١- شوێنی خڕۆکە سوورە لەکارکەوتووەکان وخوێنی پیسی ناو لاشە بەتایبەت لەکاتی خەوتندا نێوشان – کاهل – ە .

٢- شوێنێکە کاتێك بریندار دەکرێت زۆر بەزوویی چاك دەبێتەوەو ( التهاب ) ناکات بە پێچەوانەی شوێنەکانی تری لاشە .

٣- نێوشان شوێنێکە هیچ دەمارێکی لیّ نیە کەمەترسی دار بێت بۆبڕین .

٤- هیچ زەرەرێکی نیە ئەگەر ئەو کەسە نەخۆشی ( شەکرە ، ناعور )یشی هەبێت . واتە : مەترسی نیە .

٥- بەشایەدی وگەواهی چاودێران وحەجامەکران ئەو شوێنە . واتە : نێوشان تائێستا هیچ زرەرەو زیانێکی بۆسەر لاشە نەبووەو سوودی زۆریشی لیّ بینراوە .

# حوکمی وەرگرتنی کریّ بۆ حەجامە

گومانی تێدا نیە کەهەر شتێك ڕێپێدراوو ( مباح ) بێت لەشەریعەتی ئیسلامیدا دروستە بۆئەو کەسەی کەپێوە ماندوو دەبێت لەبەرامبەریدا کریّ وەربگرێت .

کریّ وەرگرتنیش لەبەرامبەر حەجامەدا جمهوری زانایان وای بۆدەچن کەکارێکی ( مشروع )و دروستەو تەنانەت دەفەرمون دروستە بکرێتە پشەو کاسبی پێوە بکرێت .

ئەو زانایانەی کەخاوەنی ئەم بۆچوونەن پێشەوایان ( شافعی وأبوحەنیفە ومالك واحمد ابن حنبل ) ڕەحمەتی خوایان لیّ بیّ . بەڵگەشیان ئەم فەرموودانەی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) :

١- عن ابن عباس رضي الله عنه : قال احتجم رسول الله (ﷺ) وأعطى الحجام أجره ولو علم كراهيته لم يعطه . صحيح بخاري

٢- عن أنس رضي الله عنه قال : احتجم رسول الله (ﷺ) وحجمه أبوطيبة ، فأمر بصاعين من طعام وكلم أهله فوضعوا عنه من خراجه وقال ان أفضل ما تداويتم به الحجامة .

* هەرچەندە هەندێك لەزانایانی ( أهل الظاهر ) و محدثين دەفەرموون دروست نیە خواردنی ئەو کرێیەی کەبەحەجامە پەیدا دەکرێ ئەگەر وەریشی گرت بانەیخوا بەڵکو لەشتێکی تردا سەرفی بکات بەڵگەشیان ئەو فەرموودەیەیە کەدەفەرموێ :کسب الحجام خبيث . أخرجه الامام مسلم وأبوداود وأخذوا بظاهر الحديث .

نهى رسول الله (ﷺ) عن كسب الحجام . رواه ابن ماجة

* ئەم بۆچوونە لەچەندین ڕێگەوە ڕەدراوەتەوە .

پێشەوا ابن القيم لەکتێبی ( زاد المعاد )دا دەڵێ : ئەو فەرموودانەی کەباس لەدروستی وەرگرتنی کرێ دەکەن لەبەرامبەر حەجامەدا هیچ ( تعارض ) ناکات لەگەڵ ئەو فەرمودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) کەدەفەرموێ : كسب الحجام خبيث . چونکە پێغەمبەر (ﷺ) کرێی داوە بەو کەسەی کەحەجامەی بۆکردووەو قەدەغەشی نەکردووە لەخواردنی . ناوبردنی کرێی حەجامە بە (خبيث) وەکو ناوبردنی سیرو پیازە وایە کەپێغەمبەر (ﷺ) هەردوو واتە : سیرو پیاز بە ( خبيثين ) ناودەبات لەگەڵ ئەوەشدا حەلاڵە خواردنیان .

* لەشەرحی ( معاني الآثار )ی پیشەوا ( طحاوي )دا هاتووە کەلەسەردەمی پێشەوا عمری کوڕی خطاب دا حەجامەکاران بازاڕی تایبەتیان هەبوو لەوێدا بەکرێ حەجامەیان بۆخەڵکی دەکرد .

- يحى کوڕی سعیدی أنصاری دەڵێ : لەهەمو سەردەمێکدا موسوڵمانان دانیان ناوە بە وەرگرتنی کرێ لەبەرامبەر حەجامەدا وهیچ کەسێکیش ڕێگری نەکردووە .

* ئافرەتێك هات بۆ لای ابن عباس پیێ ووت من ( غلام )یکم هەیە حەجامە بۆخەڵکی دەکات و لە بەرامبەردا کرێ وەردەگرێ جا خەڵکی عێراق واگومان دەبەن کە من پارەی خوێن دەخۆم . ابن عباس فەرمووی : نەخێر ڕاست ناکەن تۆ پارەی خوێن ناخۆی بەڵکو تۆ پارەی بەرهەمی ڕەنج و ماندوبونی غلامەکەت دەخۆی بۆیە هیچ حەرام نیەو

دەتوانی بیخـــۆی . [١]

- کەوابوو وەرگرتنی کرێ بۆ حەجامە ئەگەر نەیشلێین واجب یان سوننەتە ئەوە لایەنی یەکەم جائز و دروستە .

* هەندێك خەڵکی کاری حەجامە بە عەیب و شورەیی دادەنێت و پێیان وایە کەسایەتی خاوەنەکەی لەکەدار دەکات . بێ گومان ئەو بۆچوونە هەڵەیە ، چونکە لە فەرمودەی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە کە حەجامەکاری کارێکی پیرۆزە وەکو دەفەرموێ ﴿ نعم العبد الحجام يذهب بالدم و يُخفُ الصلب، و تجلو عن البصر ﴾ أخرجه الترمذي في السنن ( ٣٠٥٣ ) و البخاري .

ئەگەر چاوێك بەژیانی زانایانی ئیسلامدا بخشێنین دەبینین زۆرێك لەو زانا بەرێزانەی کە هەڵگری ڕاستەقینەی پەیامی خوابوون لە هەمان کاتدا حەجامەکاریش بوون و شانازیشیان بە کارەکەیانەوە دەکرد . دیارترینیان :

١- جنيد الحجام
٢- زيد أبو أسامة الحجام
٣- جنيد مصفر الحجام
٤- أبو صالح الحجام

ئەمانەو چەندانی تر کاری حەجامەکاریان کردووە پێشیان وابوو فەرمانی پێغەمبەریان بەجێ هێناوەو ئەم کارەیان بە خزمەتی ئیسلام و موسوڵمانان زانیوە .

(١) معاني الآثـــار

# سوودەکانی حەجامە

لە ڕاستیدا سوودو کەڵکی حەجامە لەوە زۆرترە کەبتوانرێ لەدەرفەتێکی ئاوا کورتدا باس بکرێ.

ئێستا حەجامە لەسەر ئاستی جیهاندا قسەو باسی لەبارەیەوە دەکرێت لەناو پزیشکەکاندا بەتایبەتی کەزۆربەی هەرەزۆری پزیشکان پێیان وایە کەحەجامە لەپلە یەکەکانی ئەو چارەسەرانەیە کەپێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) لەفەرموودەکانیدا باسی کردووە .

لەگۆڤاری ( نصف الدنيا )دا هاتووەو دەڵێ : حەجامە دەتوانێ عەرشی نەخۆشیەکان بێنێتە لەرزەو تەفروتوناو ڕیشەکێشیان بکات .

* پزیشکی ناودار ( عصام المقدم ) پزیشکی ( اخصائي الجراحة العامة ) لەنەخۆشخانەی التأمين الصحی لەقاهرە ، هەڵسا بەتاقی کردنەوەی حەجامە لەسەر ( ٧٠ ) نەخۆش کەهەریەکەیان گیرۆدەبوون بەچەند نەخۆشی . لەئەنجامدا دەرکەوت کەرێژەی سەرکەوتن لەزۆربەیاندا لە٥٦٪ و لەهەندی تریاندا لە ٤٣٪ وەئەوەی سوودی نەبینیبێ تەنها ( ١ ) کەس بوو لەو (٧٠) نەخۆشە . بۆزۆر نەخۆشەکان تەنها حەجامەی بەکار دەهێناو بۆهەندێکی تریان حەجامەو چەند چارەسەرێکی تری ( تقليدی )[١]
* حەجامە نەك تەنها چارەسەرە بۆ نەخۆشیەکانی لاشە بەڵکو چارەسەری نەخۆشیە دەروونیەکانیش دەکات . لێکۆڵینەوەکان سەلماندویانە کە حەجامە دەبێتە مایەی شیفاو چارەسەری زۆربەی ئەو نەخۆشیانەی کە لایەنی پزیشکی نەیتوانیوە وەکو پێویست چارەسەری بنەڕەتیان بکات . لەگەڵ ئەوەشدا کە حەجامە بنەبڕی نەخۆشیەکان دەکات هیچ شوێنەوارێکی خراپیشی بۆ سەر لاشە نیە بە پێچەوانەی سەرجەم ئەو داوودەرمانانەی کە ئێستا بەکاردەهێنرێن ومادەی کیمیاویان تێدایە کە چەندە سوودمەندە ئەوەندەش زیاتر شوێنەواری خراپ لەسەر لاشە جێ دەهێڵێ .

---

(١) گۆڤاری الاعجازي العلمي عدد ( ٥ )

* مامۆستا أحمد حفني لە ( محاضرة )یەکی دا دەڵێ : حەجامە سوودی بەدە ئەوەندەجار زیاترە لە ( الإبرة الصينية ) کە ئێستا لە هەموو جیهاندا بەکار دەهێنرێ . بە مەرجێك حەجامە بەو شێوازو دەستورە تایبەتیەی کە بۆی دیاری کراوە بکرێت .
* محمد داود حسين الرفاعي لە کتێبی ( التداوي بالحجامة في الإسلام ) . ل ( ٦٧ )دا کۆمەڵێك لەو نەخۆشیانەمان بۆ باس دەکات کە حەجامە چارەسەریان دەکات (بإذن الله تعالى ) . ئەمەی لای خوارەوە هەندێك لەو نەخۆشیانە :

١ – بەهێزبوونی ئێسقانەکان وپاڵفتەبوونی خوێنی لاشە ( تقوية العظم )
٢ – هەڵسانی دەمارەکانی شان ومل ( تشنجات )
٣ – نەخۆشی ڕەبۆ ( ربو )
٤ – نەخۆشیەکانی دڵ ( الأمراض القلبية )
٥ – شەقیقە و سەرئێشە ( الشقيقة )
٦ – کەم بینی وشەوکوێری ( ضعف البصري )
٧ – نەخۆشی ڕۆماتیزم ( روماتزم )
٨ – نەخۆشیەکانی ئافرەتان بەتایبەت ( رحم ) ( الأمراض النسائية )
٩ – خورانی پێست وسوورهەڵگەڕانی ( احمرار الجلد )
١٠ – ڕووتانەوەی مووەکان بەتایبەت ( داء الثعلب )
١١ – نەزۆکی ( عقم )
١٢ – لاوازی لایەنی ( جنسی )
١٣ – تەمبەڵی وخواڵویی ( الكسل )

* دکتۆر ( خالد حلاوة )ش هەندێکی تر لەسوودەکانی حەجامە و کاری گەری لەسەر نەخۆشیەکان باس دەکات وگرنگترینیان ئەم نەخۆشانەن :–

١ – نەخۆشی ( سرطان )
٢ – نەخۆشی شەلەل وئیفلیجی

٣- نەخۆشی شەکرە ( سکری )

٤- نەخۆشی پرۆستات

٥- نەخۆشیەکانی پشت

**تێبینی // هەندێك نەخۆش حەجامە کردن بۆیان زەرەری هەیەو پێویستە بۆئەو کەسەی کە حەجامە کارە ڕەچاوی بکات و بۆ زیاتر شارەزابوون لەو نەخۆشیانە باسەرێك لە کتێبی ( الحجامة سنة نبوية و معجزة طبية - ی شهاب البدری يسن ). لە لاپەڕە ( ٥٣ )ی ئەو کتێبەدا لە ژێر ناونیشانی ( محضورات الحجامة ) باسی ( ٣٧ ) نەخۆشی دەکات کەخاوەنەکانیان حەجامەیان بۆناکرێ ، ئەگەر کراش لەژێر چاودێری ووردی پزیشکی تایبەتدا دەکرێت .**

## زانست و پێشکەوتن لە ڕوانگەی ئیسلامدا

شتێکی بەڵگە نەویستە کەیەکێك لەخەسلەت وسیماکانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام بریتیە لەدەرهێنانی مرۆڤەکان لەتاریکیەوە بۆڕووناکی ، لە نەخوێندەواریەوە بۆخوێندەواری ، لەدواکەوتوییەوە بەرەو پێشکەوتن .

ئەوەتا لەگەڵ هەڵهاتنی خۆری ئیسلام وگەیشتنی یەکەم پۆلی ئایەتەکانی قورئاندا ، زەنگی ئاگادارکردنەوە لێدراو هەرسێ دەستەواژەی - اقرأ - والقلم - وما يسطرون - کەهەر سێکیان ئەو پەڕی مانای زانست وپێشکەوتنیان لێ دەچۆڕێ . وەدووبارەبوونەوە ووشەی - العلم - لەقورئاندا زیاتر لە ( ٧٦٨ ) جار بەهەموو ( مشتقات )ەکانیەوە ئەو پەڕی واتای پێشکەوتنە لە ئیسلامدا .

لە دەیەها فەرموودەی قورئان وحەدیسدا داواکراوە لە ئیمانداران تا هەوڵ و تواناکانیان بخەنەگەڕ لەپێناو بەدەست هێنانی زانست و زانیاریدا ئەمەیشی بە ئەرك و واجبی سەرشانیان داناوە وەکو پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) دەفەرموێ ﴿ طلب العلم فريضة على كل مسلم ﴾ وە خوای گەورە زانایانیش دەباتە ڕیزی فریشتەکانی خۆیەوە :

﴿ شهد الله لا إلاه إلاّ هو والملائكة وألو العلم قائماً بالقسط لا إله إلاّ هو العزيز الحكيم ﴾
آل عمران – ٨ –

زانست ڕێزو قەدرێکی تایبەتی هەیە لەئیسلامدا وەبەیەك چاو دەڕوانێتە زانست . دابەشکردنی زانست بۆلای زانستی دینی وغەیرە دینی پرواپڕ پێچەوانەیە لەگەڵ ناوەڕۆکی ئیسلامدا ئەگەر سەرنجێکی ووردی سورەتی ( علق ) بدەین دەبینین خوای گەورە چۆن فەرمان دەکات بە (قراءة) وخوێندنەوەی – وحي – . ئاوایش فەرمان دەکات بە ( قراءة ) وخوێندنەوەی ( كون ) وپێکەوە گرێدانی هەردوو چەمکی ( قراءة الوحي و قراءة الكون ) . داخوازیەکی قورئانەو هەرگیز نابێت لێك جودا بکرێنەوە چونکە لێك دابڕینیان دەبێتە مایەی نا هاوسەنگی لەپێشکەوتن وڕوودانی کارەسات . ئەوەتا هەر لەدوای باسکردنی خوێندنەوەی وەحی وکەونیدا باس لەسەر کەشی ولادان ولەخۆبایی بوونی مرۆڤ دەکات وەکو دەفەرموێ ﴿ إن الإسنان ليطغى أن رءاه استغنى﴾ وەکو ئەوەی پێمان بڵێ ئەگەر مرۆڤ ( قراءة )ی وەحی فەرامۆش بکات وتەنها پەرە بەلایەنی کەونی بدات لەخۆی بایی بێت وسەرکەشی دەکات ولەباتی ئەوەی پێشکەوتن بۆخزمەت کردنی مرۆڤایەتی بەکار بهێنێ بەکاری دەهێنێ بۆ قڕکردن و لەناوبردن بەکاردێنێ . بۆدەستکاری کردنی دروست کراوەکانی خوا – فليغيرن خلق الله –

وەکو بەچاوی خۆمان دەبینین ئێستا ڕۆژئاواییەکان ئەو دوو ( قراءة )ە کەداخوازیەکی قورئانە لێکیان دابڕیوەو تەنها خوێندنەوەی لایەنی کەونییان پەرەپێداوە ، لەگەڵ ئەوەشدا تاڕاددەیەك خزمەتیان کردووە بەلام واخەریکە مەترسی بۆسەر هەموو مرۆڤایەتی بەگشتی دروست دەکەن . وەکو وتم ئەگەر خوێندنەوەی کەونی لەژێر چاودێری وەحی خواییدا بەکار نەهێنرێ کارەسات دەقەومێنێ .

بۆیه به هەردووكیانەوه زاستی ئیسلامی وه پێشكەوتنی ڕاستەقینه بۆ مرۆڤایەتی فەراهەم دێنن .

لـه ئیسلامدا هەردوو چەمكەكه بەڕێزن وبەیەك چاو سەیر دەكرێن ئەوەتا ئەجرو پاداشتی پزیشكێك كەمتر نیه لـه پاداشتی فەقیهێك وەپاداشتی ئەندازیارێك كەمتر نیه لـه پاداشتی ( محدّث )ێك وەپاداشتی زانایانی فیزیاو كیمیا كەمتر نیه لـەپاداشتی ( مفسرین )ی قورئان بەمەرجێك مەبەستیان ڕەزامەندی خوابێت .

تەنها ئیسلامه شوێنی بەندایەتی و زاست بەیەكەوه دەبەستێتەوه قوتابخانەكەی پێغەمبەر(ﷺ) وەكو چۆن شوێنی بەندایەتی وخۆڕازاندنەوه بووبه ئاكارو ڕەوشتی بەرزو جوان لـەهەمان كاتدا زانكۆیەكی بێ وێنەبوو بۆ فێربوونی زانست .

* لـەسالّی ( ٢٤٥ ) كۆچی موسولّمانان لـەشاری ( فاس )ی پایتەختی ( مغرب ) یەكەم زانكۆیان لـەمزگەوتێكی گەورەدا دامەزراند . ئەم زانستگایه تایبەت نەكرابوو تەنها بۆ فێربوونی وانه ئیســـلامیەكانی وەكو تفسیرو حەدیس وفقه اصول و منطق و بلاغه و عقیده و... هتد . بەلّكو هەریەك لـەزانستەكانی طب و ریاضیات و فلك و فیزیا و جغرافیا و چەندانی تر لـەو زانستانەشی تێدا دەخوێندرا . وەشوێنی مانەوەو حەسانەوەی تێدابوو بۆئەو فێرخوازانەی كه لـه دوورەوه هاتبوون . مێژوو شایەتی ئەو ڕاستیەیه كەقوتابیانی بەشداربوو پێك نەهاتبوون تەنها لـەموسولّمان بەلّكو جیاوازبوون لـەڕووی بیروباوەڕو ئاینیدا و لـەناویشیاندا ڕاهیبێكی مەسیحی به ناوی (جوبرت) بوو دوای تەواو كردنی وانەكان ودەرچوونی لـەو زانستگایه كه ناوی ( جامعة القرويين ) بەناوبانگ بوو . گەڕایەوه وولاّتی ئیتالّیا هەربەگەیشتنی بەوێ دەستی كرد بەوەرگێڕانی هەموو ئەو كتێب نووسراوانەی كەموسولّمانان نووسیبویان بۆسەر زمانی ئیتالّی .

مێژوو گەواهی دەدات كه هۆكاری سەرەكی بۆئەو پێشكەوتنه زانستیەیەی كه ڕۆژئاوا به خۆیەوه بینی دوای گەیشتنی موسولّمانان بو بەوێ .

* بنیاتنانی یەکەم کۆلێژی پزیشکی لە ئیتاڵیاو لەسەر دەستی موسوڵمانانەدا ڕاستیی ئەو قسەیەمان دەسەلمێنێ .
* با گوێ لەنووسەری بەناوبانگی ئەڵمانی ( دریترسی فریدرك ) بگرین کەبەئاشکرا دان بەوە دادەنێ کە ئیسلام مایەی پێشکەوتنی ئەوروپابوو.

دەڵێ : ان علوم الطبيعة والفلك والرياضيات التي انعشت أوروبا في القرن العاشر للميلاد مقتبسة من ( قران محمد ) بل ان أوروبا مدينة للإسلام الذي جاء به محمد (ﷺ) .[١]

# چەند زانیاری و تێبینیەکی گرنگ بۆ حەجامەکار و حەجامە بۆکراو

* حەجامەکاری بەڕێز دوای ئەوەی کەزانیت کارەکەت کارێکی پیرۆزو پڕخێرەو توێشوی قیامەتە و ڕزگار کردنی بەندەکانی خوایە لەنەخۆشی دەمەوێ چەند زانیاریەکی گرنگ بخەمە بەر دیدی تۆی ئازیز :

١- بەناوی خوا دەست پێبکەو ( ٧ ) جار سورەتی فاتیحەو ئایە الکرسی بخوێنە بەئومێدی خوا کارەکەت دەبێتە شیفاو سوودی باشتری دەبێت .

٢- هەوڵ بدە ئەو ڕۆژەی کاری حەجامەی تێدا ئەنجام دەدەی ڕۆژێکی ساف وڕوون بێت وبای نەبێت .

٣- ئەگەر حەجامە بۆکراو ئافرەت بوو پێویستە کەسی نزیکی خۆی لەگەڵدا بێت ڕێگە مەدە بە تەنها بێت .

٤- لە کاتە زۆر ساردو زۆر گەرمەکاندا خۆت بپارێزە لەحەجامە بۆخەڵکی کردن .

٥- خۆت بپارێزە لەحەجامە کردن لەشەواندا .

[١] الحجامة في الطب النبوي - ل ( ١١٢ )

٦- هەندێك كەس هەیە حەجامە كردن زەرەرمەندە بۆیان پێویستە بەڕێزت هۆشیار بیت .
٧- لەكاتی حەجامە كردندا دەستەوانەت لەبیر نەچێت .
٨- موس وگوێزانی بەكارهاتوو بەكار نەهێنیتەوە بۆ كەسانی دی ودوای بەكار هێنانی بیفەوتێنە .
٩- ئەگەر كرا پەرداخی كەس بۆ كەسی تر بەكار مەهێنە چونكە هەندێك نەخۆشی لەڕێگەی خوێنەوە دەگوازرێتەوە . ئەگەر نا چاریش بووی دەبێ زۆر بەجوانی پەرداخەكە بشۆری پاشان بەكاری بهێنیتەوە .

**ئەو كەسانەی كە حەجامەیان بۆ دەكرێت**

**پێویستە ڕەچاوی ئەو خاڵانەی خوارەوە بكەن :**

١- پێویستە دڵنیابی لەوەی كەحەجامە شیفایەو چارەسەری نەخۆشیەكەت دەكات مەرجیش نییە بەیەك جار ئەنجامدانی حەجامە شیفات بۆ بێت ، بەڵكو پێویستە چەندین جار دووبارە بكرێتەوە .
٢- ئەو بەیانییەی كەدەتەوێ حەجامەی تێدا بكەی هەوڵ بدە كەم بجوڵێ تا ئەو خوێنەی كەلەناو شانتدا كۆبۆتەوە بڵاوە نەكات .
٣- هەوڵ بدە بەیانی نان مەخۆ ولەسەر برسێتی حەجامە بكە ، چونكە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ ﴿ الحجامة على الريق دواء وعلى الشبع داء ﴾ .
٤- پێویستە بۆماوەی ( ١٢ ) كاتژمێر پێش حەجامە كردن خۆت دوور بگری لەخێزانت و (جماع)ی لەگەڵدا نەكەی .
٥- خوشكی بەڕێز پێش تەمەنی ( ٤٠ )ساڵی خۆت بپارێزە لەحەجامە كردن .
٦- دوای حەجامە كردنت باش وایە بەئاوی سارد خۆت بشۆری ، چونكە پێشەوا شافعی ڕەزای خوای لێ بێ دەفەرموێ : حكمەت لەو خۆشۆرینە ئەوەیە كەلاشە چوست وچالاك بێتەوە ، چونكە حەجامە وائەكا كە لاشە هەست بەلاوازی وداهەزان بكات .
٧ - پێویستە بۆماوەی زیاتر لە كاتژمێرێك دوای حەجامەكردن نان نەخۆی .

٨- پێویسته دوای حەجامه کردن بۆماوەیەك خۆت دوور بگری لەخواردن وخواردنەوەی شتی مزرو ترش ، بەتایبەت ماست وهاوشێوەکانی .

- ابراهیم الازرق ، دەڵێ : ئەو کەسانەی خوێن لەخۆ دەگرن وحەجامە دەکەن پاشان ماست وماستاو و پێکهاتەکانی و شتی مزرو ترشی دەخۆن مەترسی ئەوەیان لێ دەکرێ تووشی بەڵەکی ببن.

٩- پێویسته بۆماوەی ( ١٢ ) کاتژمێر نەچێته لای خێزانی واته ( جماع )ی لەگەڵ نەکات .

١٠- دەبێ دوای حەجامه کردن بۆماوەی ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ بحەسێتەوەو ئیسراحەت بکەی چونکه جوڵەی زۆر وا ئەکا کەسودێکی ئەوتۆ لەحەجامەکردنەکە نەبینی .

١١- دوای تێپەڕبوونی دوو ڕۆژ بەسەر حەجامەکردنەکەدا هەست بە بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی لاشه .واته : تا دەکەیت ئەوه شتێکی سروشتییەو هیچ مەترسییەکی نییه .

# دوا ووته

خوێنەری ئازیز – لەکۆتایی ئەم بابەتەدا دەمەوێ ئەوە بلێم کەکاتێك باس لــە ( حەجامــە ) دەکەین بەم شێوەیە ئەوە ناگەیەنێ کە فەزڵ ورێزی ( حەجامە )مان دابێت بەسەر چارەسەرەکانی تردا ، بەڵکو چەندین چارەسەری تریش لەقورئان وفەرموودەدا هاتوون وباسیان لێوە کراوە وەکو ڕەشکە و هەنگوین و ........هتد .

بەلاّم من لەناو دەرمانخانەی قورئان وسونەتدا ئاماژەم بە یەك دانە لەچارەسەرکرد کە ( حەجامە )یە لەبەر ئەو سوود وکەڵکە زۆرەی کەهەیەتی ولێی بینراوە . هەرچەندە من خۆم ( حەجامە)کاریش نیم ، بەلاّم چەند جارێك ( حەجامە )یان بۆکردووم وسوودی یەکجار زۆرم لێ بینی بۆیە پێم خۆش بوو بابەتێکی ئاوا کورتی لەسەر ئامادە بکەم وبنوسم تاخەڵکی پێ ئاشنا بکەم بۆئەوەی ئەوانیش خۆیان لێ بەهرەمەند بکەن بەو ئومێدەین کەئێوەی ڕێزدار سوودی لێ ببینن وببێتە مای ڕەزامەندی خوای گەورە .

## وهو حسبي ونعم الوكيل

أنور أحمد مصطفى

١ / ١٠ / ٢٠٠٥

## سەرچاوەکان


* موسوعة الطب النبوي - ج/١ . ابن القيم الجوزي
* الحجامة في الطب النبوي – عبدالكريم محمد نصر
* الشمائل المحمدية – الإمام أبي موسى بن سَورة الترمذي
* معجزة قرن العشرين الدواء العجيب – محمد أمين شيخو
* التداوي بالحجامة في الإسلام – محمد داود حسين الرفاعي
* الحجامة سنة النبوية ومعجزة الطبية – شهاب البدري يس
* الحجامة في الفقه والحديث – وضاح مجدالدين الخطيب
* العلاج بالحجامة بين الطب والدين – محمد نبيه – مكتبة الصفاء
* الفقه المنهجي – ج/١
* کۆباسەکانی میحراب – ١-٦ –حاجی شماڵ عبدالرحمن الموفتی
* کۆپی کردنی مرۆڤ و زیانە دیـار ونادیـارەکانی لەڕوانگەی شەریعەتی ئیسلامیەوە – أنور أحمد مصطفى
* موضوع من الإنترنيت
* موضوع المعددة – تحت عنوان – الدواء العجيب – الحجامة - اعداد أسعد شاكر أمين


**بإشـراف : الأستاذ الحجـام – علـي طـاهر قـادر**

# ئەم نامیلکەیە

- ئاگادارکردنەوەی موسڵمانانە لەو چارەسەرە کەم وێنەیەی کە زۆر دەمێکە پشتگوێ یان خستووە و لێ ی بێ ئاگـان .
- بانگەوازێکی دڵسۆزانەیە بۆ گەڕانەوە بۆ چارەسەرە ئیسلامی یە رەسەنەکـان .
- گرنگی چارەسەری نەخۆشیەکانە لە ئیسلام دا .
- هەوڵ و کۆششی موسڵمانانە بە درێژایی مێژوو بۆ دۆزینەوەی هۆکاری نەخۆشیەکان و دۆزینەوەی چارەسەری گونجاو بۆیان .

ژمارەی سپاردنی (487) لە لایەن بەڕێوەبەرایەتی گشتی ڕۆشنبیری و هونەری پێدراوە